- حەمەی نادر هەبوو لەو شارەزووره. برایەکی هەبوو ئەم برایە ژنێکی هەبوو رۆژی کولابوو بە دەستیەوە؛ هەموو جار گلەیی لەلای حەمە ئەکرد کە ژنەکەی لە گەڵیا باش نییە. حەمەش پێی ئەوت: برام تۆ خۆت پیاو نیت، ئەگەینا ژن چییە پیاو بەدەستیەوە بکەوێتە زەلالەتەوە؛ دەسا ژنەکەی من هەرکە چاوی لێ بەرز ئەکەمەوە لەوانەیە زەنەقی بچێت. ئەویش وتی: جا برا تۆ چیت لەگەڵ کردووە وا بەو جۆرە هاتۆتە ژێر رکێفت. [حەمە وتی:]هەرکە جوولاوەتەوە بە تاکە کەوش سەر و گوێلاکیم ناوەتە یەک. جارێک دوو جار وام لەگەڵ کردووە ئێستە ئیتر وەکوو ماستی مەیوی لێهاتووە. وتی: سا برا وەڵڵا منیش وای لەگەڵ ئەکەم. یا خوا کارت راس بێ برا وا ئەم رێگەیەت پیشان دام! ئیتر بێ گومان رزگارم ئەبێ.

کابرا بەدڵێکی خۆشەوە چووەوە بۆماڵەوە. هەرکە چووە ژوورەوە بە بێ چرپە تایێ لە کەوشەکانی داکەند بۆ ئەوە بیماڵێ بەسەر ژنەکەیا و ئاقڵی بکا. ژنەکەی چاوی پێ کەوت لێی شێتان و وتی: کورە ئەوە شێت بووی وا ئەو تاکە کەوشەت داکەند؟ کابرا وتی: نەوەڵڵا خانم گیان! ئەوە بۆ ئەوەم داکەند بیماڵم بەسەرخۆما.

- کابرایەک هەبوو زۆر لەژن ئەترسا، لە لایەوە وابوو ژنی بێ گۆبەن نییە. پاشان ناو و نیشانەی ژنێکی بەحەیا و حسمەتیان بۆ هەڵدا و لەگەڵ ئەمەشا زۆر دەست رەنگینە. چوو ئەو ژنەی هێنا و نەوکلی دایە سەرخۆ. شەوێ لە ژنەکەی پرسی ئایا تۆ هیچ دەست رەنگینی و پیشەیکی دەستیت هەیە؟ وتی: نەوەڵڵا من پیشەو سەنعەتم لە قاچمایە. وتی: دەک موبارەک نەبێ.

## تاڤگەی ئێلاخ

- لە قسەی کوردییە ئەڵێ:

جارێک ریوییێک لەو بنارەدا تێ ئەپەڕێ ئێسترێکی تۆڕ تێری خواردبوو ڕاکێشا بوو بەتەواوی نووستبوو، هیچ جووڵەی نەئەکرد. ریویەکە بەپشتیا تێپەڕی گوڵمەی قنگی دەرپەڕیبوو. ریویەش لای وابوو ئێسترەکە تۆپیوە تەماعی کردە قنگەسوورە دەرپەڕیوەکەی. چەمۆڵەییکی بۆ درێژ کرد. هەر چەمۆڵەی گەیشتە قنگی ئێستر، ئێستر ڕاچەنی و ڕاپەڕی‌و ڕاست بووەوە. چەمۆڵەی ریوی لەناو قنگیا گیری خواردو خۆیشی بە پاشووی ئێسترەوە داڵە ڕۆچکە بوو. ئێستر کەوتە جامبازە بەو دەشتەدا. لەرێگەی دا چەقەڵێک چاوی پێیان کەوت وتی: «ها خێرە مام ریوی وا خۆتت بە پاشکۆی ئەو ئێسترەدا هەڵواسیووە؟ ڕەنگ بێ بەخێر بۆ حەج بچن».

ریوی وتی: «بەخوا ئاغە چیت عەرز بکەم، ژیان و مردنم بەستراوە بەتڕێکی ئەم ئاغەمەوە. بەخێر ئەگەر ئەم تڕێکی کەند ئەو وەختە فیکرێکیش لەحەجەکە ئەکەینەوە».

- تینووم بوو لەگەڵ مام پیرداود دانیشتبووین. لەبەر ئەوە ریشی سپی بوو حەزم نەکرد ڕاستەو ڕاست بڵێم ئاوم بۆ بێنە؟ وتم: بەخوا مام پیرداود ڕەنگ بێ ئاوەکە ساردبێ. وتی: ئا. وتم: پیاو ئارەزووی خواردنەوە ئەکا. وتی: «ئا». وتم: ئەگەر پیاو تینوی بێ بڕوا ناکەم ئەگەر ئاو بخواتەوە سەرمای بێ. وتی «هم». وتم: جا ئەگەر پیاو تینووی بوو چی ئەکا؟ وتی: ئاو ئەخواتەوە. ئێستە و ئەوسا ئاوی هەر بۆ نەهێنام. منیش وتم ئەگەر بەمجۆرە بەدەمیەوە بڕۆین تا ئێوارە لێ نابینەوە و وازم لێهێنا.

- کابرایەک هەبوو کوڕێک و ئاشێکی هەبوو. بەکوڕەکەی وت: ڕۆڵە ئەگەر ئەزانی شتی‌ترمان زۆرە، ئاشەکە بفرۆشەو ژنێکی پێ بێنە بۆخۆت.

کوڕەش چوو ئاشەکەی فرۆشت و بە پارەکەی ژنێکی هێنا. لەپاش ماوەیەک لات کەوتن، هیچیان نەما. وتی: تەماشاکە ئەوی ئارد ئەڕی فرۆشم بۆ ئەوەی گوو ئەڕێت.

- مەلا یەحیای چوورستانی بۆی گێڕامەوە وتی:

ئەحەی کڕنوو چوو بوو بۆ حەج و گەڕابووەوەو گەیشتبووە «تسن»ی کەرکووک. کەشیدەیەکی حاجیانی لەسەر بەستبوو. لەو کاتەدا لەتسن مردوویەکیان لێ مردبوو،

بردبوویان بۆ سەر قەبران. پەکیان کەوتبوو بۆ مەلایێک تەلقینی بخوێنێ کە حاجی ئەحمەد بەوێدا تێئەپەڕی. بەمەلای ئەزانن بەرۆکی ئەگرن بۆ ئەوە تەلقینی مردووەکەیان بۆ بخوێنێ. ئەویش هیچ خۆی تێک ناداو ئەچێتە سەر گۆڕەکەو بەم جۆرە تەلقینەکە ئەخوێنێ ئەڵێ: «کەرکوکی ئێبن کەرکووکی خواردنت سلق و یارکۆکی کە نەکیرت دێنە سەر گوێ تەپ نەکەی وەکوو کەر هەستە بڵێ تلی تلی دەستم لەدەستی شاقولی کفنم ئەخەمە سەرملی ئەچمە جەحەنم تا بنی تەلقینەکەت لەبەر... بوتیە خوێنم اللّٰەاکبر».

وتم مەلا ئەمە ئەگەر شعرە زۆر لەنگە. وتی: «ئەحەی کرنوو بەشعری ئازادی ئاوروپی ئێستە وتویە خۆی نە بەستۆتەوە بە وەزن و قافیەوە».

- ساڵێک والیەک ئەچێتە «توزخورماتوو» لەو ئیشانە کە ئەیکا یەکێکیان ئەوە ئەبێ کە خەڵکەکەی ئەوێ فێری نوێژ کردن بکا. جاڕ ئەدا هەرکە نوێژ بکا هەموو ڕۆژێ مەتالیکێکی ئەداتێ. تەقە ئەکەوێتە دوزەوە کەس نامێنێتەوە کە نوێژ نەکا.

هەتا چل ڕۆژ بەمجۆرە لەگەڵیان ئەڕواو پاشان پارەکەیان لێ ئەبڕێ. سەیر ئەکا کەس نەچووەوە بۆ نوێژو هەموو لێی پەشیمان بوونەوە. پێی وتن: ئەوە بۆ نوێژەکەتان دایە دواوە؟ پێیان وت: «ئێمە هەر بەقەدر پارەکە نوێژ ئەکەین؛ پارە بدە تا نوێژ بکەین».

- کابرایەکی شارەزووری بەمیوانی ڕێی ئەکەوێتە سولەیمانی و شەوێ ئەچێتە ماڵی دۆستێکی. شەوێ چاو ئاوێکی ساردی زۆری لێ ئەخواتەوە. لە کاتی نووستنا لە ژووریکا ئەینوێنن و دەرکەی لەسەر دائەخەن؛ کەسی تریش لەژوورەکەدا نابێ تەنها منالێکی چوار پێنج سالانی خانە خوێکە نەبێ.

شەوێ کابرا میز زۆری بۆ دێنێ. هەڵئەستێ بچێتە دەرەوە سەیر ئەکا دەرگا لە پشتەوە داخراوە. ئەگەڕێتەوە زۆر پەریشان ئەبێ خۆی ڕاناگرێ، فیکر ئەکاتەوە بچێت منالەکە لابا و میزەکەی بکاتە ناو جێگاکەی ئەوەوە کە بەیانی هاتن ئەڵێن ئەمە منالەکە خۆی میزی کردوەو کابراش ڕزگاری ئەبێ. لەڕاستیدا فیکرێکی باش بوو کابرا ئەچێ منالەکە هەڵئەگرێ ئەیخاتە جێگاکەی خۆی و پڕ ناو جێگای منالەکە ئەکا لە میز و ڕزگاری ئەبێ. ئەمجا دێتەوە منالەکە هەڵئەگرێ ئەیباتەوە بۆ ناو جێگاکەی خۆی و ئەمیش دێت لەشوێن خۆی ڕائەکشێ.

کە رائەکشێ سەیر ئەکا لارانی ئەکەوێ لەشتێکی شل و بۆنێکی پیسیش دێت. تومەس ئەمە منالی زیرەک لەو وەختەدا کە کابرا هەڵیئەگرێ و ئەیهێنێتە ناو جێگاکەی خۆی بەعادەتی شەوانی لای وا ئەبێ ئەوە دایکی هەڵیساندوە بردوویە بۆ سەر ئاودەست ناو جێگای کابرا پڕ ئەکا لەپیسایی.

سەیرتر ئەوە بوو تا بەیانی میزی کابرا لەناو جێگای منالەکەدا وشک بووەوە.

- جوولەکەیک هەبوو لەسابلاخ «شەلەمۆ»ی ناو بوو؛ کچێکی هەبوو دابووی بەشوو. لەلای جوولەکە کە کچ درا بەشوو ئەبێ پارەیەکی باش بخرێتە تەکی. شەلەمۆ دووسەد تمەنی خستبووە تەک کچەکەی. شەوێ کابرای زاوا نەئەچووە پەردە ئەیوت دووسەد تمەن چییە خستوویانەتە تەکی؟ بەناچاری بەشەلەمۆیان وت. شەلەمۆ بە تووڕەییەوە هات بۆ مالی زاواو پێی وت: «هەی سەگی سەگباب! من کچێکی چواردە سالەم بە دووسەد تمەنەوە پێ داوی و ئەلێم بیگێ؛ کەچی تۆ نایگێیت. وەرە تۆ سەد تمەن بە من بدە هەتا من خۆت و هەچ خزم و عەشرەتێکت هەیە هەمووتان بگێم».

- کابرایک وا چوو بووە دلیەوە کە بووە بەگەنم و مریشک ئەیخوا. لەبەر ئەمە کون بەکون خۆی لەمریشک ئەشاردەوە. لەدواییدا چار نەما گرتیان و خستیانە شێتخانە. ماوەیەکی پێچوو وتیان چاک بوەتەوەو هێنایانە دەرەوە. هەرکە چۆوە مالەوە مریشکێکی بەرچاو کەوت، دایە بانگەلاو هاوار هاوار. کەس و کاری وتیان: ئەرێ ئەوە هاوار هاواری چیتە؟ خۆ تۆ دەنکەگەنم نیت مریشک بتخوا. وتی: «بەلێ ئەزانم، بەلام ئێوە بەمریشکەکەی بسەلمێنن کە من دەنکە گەنم نیم».

- مەلا نادریک هەبوو لووتێکی ناقۆلای پێوە بوو. رۆژێک ئەچێتە مالی یەکێ لەقوتابیەکانی. ئەو قوتابییەی برایکی بچکۆلەی ئەبێ، مەلا نادری چاو پێ نەکەوتبوو. دایکی کوڕەکە لەترسی ئەوە نە وەک کوڕەکەی کەچاوی کەوت بەلووتی مامۆستا دەست بکاتە قسەکردن وەیا پێکەنین ناردیە مالە دراوسێکەیان.

مەلا نادر هاتو دانیشت و باجی ئایشێ بەخێراتنی کرد، بەلام هەر دلی لەمستیایە نە وەک کوڕەکەی بێتەوە. لەو کاتەدا کە پیالە خالیەکە لە بەردەمی خۆیا دائەنێ و ئەیەوێ شتێکی تێکا بۆ مامۆستا پێی ئەلێ: «مامۆستا شیر بکەمە لووتیەوە یا قاوە».

- کابرایەک لەگەڵ ژنەکەیا و چوار منالیا لە ژووریکا ئەنووستن. ئەگەر جاریک بیویستایە گەمەو گاڵتەیک بکەن لەگەڵ ژنەکەیا منالەکان لێیان ئەبوون بەشملی شەڕ و لێ نە ئەگەران.

ڕۆژێک کابرا چوو هەندێ گێزەری کڕی هێنایەوە بە هەر منالە مستە نۆکێک و گێزەرێکی دایە، وتی بچن لەژێر لێفەکەوە بۆ خۆتان بیخۆن، بەڵام ئەبێ دەنکە دەنکە نۆکەکە بخۆن. ئەگەر هەر کەس دوو دوو بیخوا گێزەرەکەی لێ ئەستێنمەوەو ئەیبڕمە قنگی. منالان چوونە ژێر لێفەوە خەریک بوون بە نۆکی برژاو خواردنەوە. کابراش بە دڵنیایی لەگەڵ ژنەکەیا دەستی کرد بەئیشی خێرکردن.

لەپاش ماوەیەک یەکێ لە منالەکان -کە نۆکەکەی تەواو بووبوو- سەری لەژێر لێفەکە دەرهێنا سەیری کرد ئەوا باوکی سواری دایکی بووە، قیژانی وتی: «منالەکان منالەکان! تەماشاکەن وادیارە دایکم نۆکەکەی دوودوو خواردووە، ئەوەتە باوکم گێزەرەکەی تێ ئەبڕێ».

- لەسەردەمی تورکەکانا کابرایکی سمێڵ بابڕی کوردی خەڵکی ئەو سەرە بۆ کاسبی ئەچێ بۆ ئەستەموول، بەڵام کابرا، کابرایکی کەڵەمێردی جوانچاک لە دەمە دەمی گەڕانەوەیا بۆ وڵات ڕۆژێک بەناو کۆڵانێکا تێ ئەپەڕێ. ژنە دەوڵەمەندێکی مێردفسر لەسەر بانەوە چاوی پێ ئەکەوێ و ئەزانێ کابرایکی غەریبە، لەدڵی خۆیا ئەڵێ ئەگەر لەگەڵ ئەم کابرایەدا ڕێکەوم بەبێ گومان منالێکم ئەبێ و بەتەواوی بنج لەسەر ماڵ و ملکی مێردەکەم دائەکوتم.

کارەکەرێک ئەنێرێ بەشوێن پیاوەکەدا و بانگی ئەکا و پێی ئەڵێ: من حەز ئەکەم جارێ لەگەڵ تۆدا دروست بیم بەڵکوو منالێکم ببێ. کابرای کوردەی ساڵەها دوور کەوتووی لەماڵ و منال وەکوو بارە شاری هاتبێتەوە، وائەزانێ و بەتایبەتی ژنەکە هەندێ پارەشی ئەداتێ.

لە وەختی ئیشا کابرا ئەڵێ: «خانم ئارەزووی خۆتە ئەگەر نیوەی بەرم کوڕەکەت ئەبێ بە یوزباشی، ئەگەر هەمووی بەرم ئەبێ بە بنباشی ئیتر تۆ کامت ئەوێ ئارەزووی خۆتە». ژنە ئەڵێ: دیارە حەز ئەکەم ببێ بە بنباشی.

کابرا دەست ئەکا بەئیش لەو وەختەدا ژنە -بلامانێ- بایکی بە دەنگی لێ بەرئەبێتەوە. کابرا ئەڵێ: «داخی گرانم خانم کوڕەکەت بە هیچ گوێک نابێ تەنها ئەوە نەبێ کە ئەبێ بە بۆرییە ژەنی قشلە».

- دزیک لەتاریکە شەویکا چووە مالێک بۆ دزی. هەر چەندە گەڕا هیچی دەست نەکەوت. لەبەر زۆر گەڕان تینویشی بوو گۆزەڵە شرێک دانرابوو چووە سەر گۆزەڵەکە سەیری کرد ئەویش کونە و تنۆکێ ئاوی تێدانییە. بەنسک و ناهۆمێ گەڕایەوە دواوە.

لە گەڕانەوەدا گوێی لە دەنگێک بوو راوەستاو گوێی راگرت سەیری کرد ئەمە ژن و مێردەکە ئیشی شەرعییان کردووەو قسە ئەکەن. پیاوەکە بەژنەکە ئەڵێ: ئەوێ من دام بەتۆ هەزار لیرە دێنێ. ژنەش بەپیاوەکە ئەڵێ ئەوێ من دام بەتۆ دوو هەزار لیرە دێنێ. لەم کاتەدا دزەکە توورە بوو وتی: «سەگبابینە ئێوە شەوێ سێ هەزار لیرە مامەڵە ئەکەن کەچی تۆزێ گۆزەڵە شڕەکەتان پینە ناکەن ئەگەر موسڵمانێک هات تۆزێ ئاوی لێ بخواتەوە».

- لەتاران دوکتۆریک شوێنی تایبەتی کردبووەوە بۆ هاتوچووی نەخۆشەکان. ئەم خانوەی دوو دەرگای هەبوو یەکێ لەپێشەوە یەکێ لەپاشەوە. دەرگای دواوەیان تێکدابوو خەریک بوون چاکیان ئەکردەوە؛ کرێکار ئیشی تێدا ئەکردو و رێگاکەی وای لێ هاتبوو بەکەڵکی هاتووچووی نەخۆش نەئەهات.

بە شاگردەکەی خۆی ئەڵێ: لەسەر قاقەزێک بنووسێ «لەبەر ئەوە دەرگای دواوە وێرانە لەدەرگای پێشەوە تەشریفتان بێت». ئەم پارچەیە بدا بەقەد دیواری خانووەکەوە بۆ ئەوەی ئیتر لەو دەرگای پاشەوە هاتوچوو نەکرێت تا چاک ئەکرێتەوە.

شاگردەکە سریش ئەدا لەپشتی پارچە قاقەزەکەو ئەیەوێ بینووسێنێ بە دیوارەکەوە لەو کاتەدا دوکتۆر بانگی ئەکا ئەمیش پارچەقاقەزەکە بە بەرەواژەیی لەسەر کورسییێک دائەنێ و ئەچێ بەدەم دوکتۆرەوە. کوتوپڕ لەو دەمەدا ئافرەتێکی نیوە نەخۆش دێت بۆ لای دوکتۆر و لەسەر کورسیە دائەنیشێ قاقەزە تەڕکەی پێوە بوو. قاقەز راست ئەنووسێ بەشوێنی دانیشتنی ئافرەتەکەوە. ئافرەت بەناو شەقام و کۆڵانا وەکوو کۆتر ئەڕوا بەرێگادا هەموو رێبوارێک کە لە پشتیەوە تێئەپەڕن سەیر ئەکەن ئاگاداریەک بە دەر قنگی خانمەوەیە نووسراوە: «لەبەر ئەوە دەرگای دواوە وێرانە لەپێشەوە تەشریفتان بێت».

- لەجەنگی یەکەما ئەوە بوو لەشکری هەموو ولاتێک چوو بووە ولاتێکی ترەوە ئەڵمانەکانیش چووبوونە فەرەنسەوە. سەربازی دڕ نەدیوی ئەڵمان خانمەجوانەکانی فەرەنسە ئەبینن هۆشیان لانامێنێ و پەلامار ئەدەن. پیرێژنێکی فەرەنسی سەیر ئەکا کەس بەلای

ئەوەوە ناچێ لەمە زۆر تووڕە ئەبێ ئەڵێ: «ئەی خوا بۆ هەموو کەس جەنگە کەچی بۆ من ئاشتییە».

سەربازێکی ئەڵمانی گوێی لێ ئەبێ لای وا ئەبێ ئەمە جنێوی ئەداتێ ئەچێت بە شەپە زللە بەر ئەبێتە وێژەی پیرێژنی ئەرامەنە، ئەوەندەی لێ ئەدا ئەمرێ. لەپاش ئەوە کە ئەیخەنە گۆڕەوە نەکیر و مونکەر دێنە سەری. نەکیر لێی ئەپرسێ خوای تۆ کێیە؟ پیرەژن ئەڵێ: تۆ پێم بڵێ تۆ کێیت؟ ئەڵێ: من نەکیرم. ئەویش ئەڵێ: خوا ئینسافت بێ لێرەش هەر نەکیر؟ ئەی کیر لەکوێیە؟

– لەبەغدا گەلێ لە «کوێر»ەکان مۆزیقا لێ ئەدەن. ڕۆژێک پیاوێک بەیەکێ لەو کوێرانە ئەڵێت کە ەموو ڕۆژێک بچێت بۆ مالیان فێری موزیقای بکا. کوێرەش مالی کابرا نازانێ کابرا ناوو نیشانی مالەکەی خۆی ئەداتێ کە لە وەزیریە لە فلان شوێن بە دەستی ڕاستەوە دەرگای چوارمە، کە پارچە تەختەیەکی بچووک لە تەنیشتیەوە داکوتراوەو ناوی خۆی لێ نووسراوە ئەوە مالی ئەوانە.

کوێرەی موزیقار ڕۆژی دوایی ئەڕوات بەناو و نیشانەکە ئەچێتە کۆلانەو بەپاڵ دیوارەکەدا بە دەستکوتان ئەڕوا. دەرگای یەکەم و دووەم و سێیەم نە، ئەگاتە دەرگای چوارەم لەو کاتەدا بەرێکەوت «حەزەرەتی» لە شۆرجە برنج و ڕۆنی بەحەمالیکا ناردبوو بۆ ئەو مالە. حەمال کە لە تەنیشت دەرگاکەوە ڕاوەستابوو چاوەڕێی پسوولەی گەیشتنی برنج و ڕۆنەکەی ئەکرد لە فەرەیدونی خۆمان.

حەمالە ڕەسمیەکانی بەغدا هەر یەکە «باج»یکیان پێیەو ئەم باجەیا لە قورقوشم وەیا لە شتێکی ترەو بەسەر سنگیانەوە هەلی ئەوەسن.

کوێرەی موزیقار بە دەستکوتان کە ئەڕوا لەپێشا دەستی ئەکەوێتە سەر پارچە «باج»ی حەمالەکە وا ئەزانی ئەمە دەرگاکەیەو ئەمەش پارچەی تەنیشت دەرگاکەیە کە فەرەیدون پێی وتوە. ئەمجا دەست بە سەرسنگی حەمالی ئەو بەدەرگا زانیوەدا دێنێتە خوارەوەو دەعبای حەمال دیت بەدەستیەوە ئەوا ئەزانێ ئەوە ئەلقەرێزی دەرگاکەیە دەست ئەکا بەکوتانی. حەمال ئەکەوێتە گرمەگرم و بۆلەبۆل موزیقار وا ئەزانێ ئەمە «عود»ەکەی شانیەتی وا دەنگی لێوە دیت. دەست لە کیری حەمالە بەرەلا ئەکا و بە پەلە دەست ئەبا بۆ عودەکەی ئەلێ: «سەگباب خێوکە! من دەرگاکەم کوتا ئیتر تۆ ئەم ئاوازە خوێندنەت لەچی؟»

بەم جۆرە فەرەیدون مامۆستای بۆ خۆی راگیر کرد کە فێری عود لێدان بێت.

- تازە ئۆتۆمۆبیلە پاسەکان کەوتبوونە ناوشاری سولەیمانی بۆ هاتوچوو کردنی خەلک بەناو شارا، کابرایکی «مرانە»یی لەگەل ژنەکەیا هاتبوونە سولەیمانی و سواری پاس بووبوون. وا رێکەوتبوو ژنەکە لەپێشەوە دانیشتبوو مێردەکەی لەبەشی دواوە. کابرای مێرد پارەی هەردووکیانی دابوو پاسەکەش پڕیبوو لەخەلک لەو ناوەدا کابرا هەستا و بەدەنگی بەرز بانگی کرد لە ژنەکەی: «ئایشێ ئایشێ من لەدواوە داومە، ئیتر تۆ لە پێشەوە مەیدە».

- تازە شەڕی یەکەم براوبووەوە کابرایەکی ئینگلیزی لە ئینگلتەرە قسەی بۆ دۆستێکی ئەکرد وتی: کوردەکان هەتا بلێیت پیاوی چاکن و خزمەتی میوان زۆر ئەکەن. هەر کە میوانێک ئەچێتە ناویان ئەیبەنە مالەوە پەزیرایی لێ ئەکەن. ئەیبەن بۆ گەڕان، ئەیبەن بۆ ناو باخ، شتی خۆشی ئەدەنێ سەرو روومەتی ماچ ئەکەن، بەشەو لەتەنیشت خۆیانەوە ئەینووێنن، لە حەماما دەست بە هەموو لایەکیا دێنن و ئەیشۆن؛ بەکورتی بە هەموو جۆرخزمەتی ئەکەن.
کابرای دۆستی وتی: جا تۆ کەی چویت بۆ کوردەواری تا ئەم هەموو نەوازشە ببینی؟
ئەویتر وتی: من خۆم نەچووم ئیمسال ژنەکەم چوو بوو هاتەوە گێڕایەوە.

- سێ کابرای سیان ئەچنە هەولێر مەنارەی «شێخی چۆلی» ئەبینن، بەلایانەوە زۆر سەیر ئەبێ و هەر سەیری ئەکەن یەکێکیان ئەلێ ئەمە چییە؟ ئەمە بە هەقری من قاربی ئەرزە. یەکێکی تریان ئەلێ: وا نییە ئەمە بیرەکەی قوچە بلباسە هێناویانە لێرە هەلیان گێڕاوەتەوە لۆ ئەوەی ئاوەکەی وشک ببێ دیسانەوە سواغی بدەنەوە. سێیەمیان ئەلێ: ئەوە ئێوە چ دەرێن؟ ئەمە کێری ئەرزەو ئەچێ بەقوزی خوشکی ئاسمانێدا.

- کابرایەکی کورد تەلاقی ئەکەوێ و ئەچێتە لای شێخ بابەعەلی تەکیەیی لەسولەیمانی ئەلێ: «یا شێخ هانام هاوردگەسە درگاکەت تەلاقم خواردگەو منالدارم». بابەعەلیش ئەلێ: چیت وتوە؟. ئەلێ: «قوروان کە من وتم وە ژنەکەم تەلاقت کەوتوێ ئەو وتی شیڕ».
بابەعەلی ئەلێ: چۆن شیڕێک؟ درێژ بوو یا کورت؟ ئەلێ: قوروان نەدرێژو و نەکورت. ئەلێ ئەتوانێ بیلێیت ئەلێ: قوروان دوو سێ شیڕی لەوێدا پێ لێ ئەدا ئەمجا ئەلێ ئەتوانی ژنەکەشت بینی؟ ئەلێ: قوروان خاس ئەتوانم ئەو ئەچێ بەشوێن ژنەکەیا.

لەم لاوە شێخ بابەعەلی چەند کەسێک کۆ ئەکاتەوەو چاوەڕێی هاتنەوەی کابرا ئەکەن لەگەڵ ژنەکەیا. ئەمجا دێنەوە بابەعەلی لە ژنەکە ئەپرسێ ئەڵێ چۆن بوو؟ ژنەش ئەڵێ: قوروان ئەم دەویت باوکە وتی: هەر سێ تەلاقت کەوتوێ منیش وتم شیر، گووت خوارد. بابەعەلی لەوێدا دوو سێ شیرێش کورت و درێژ بەژنەکە دائەهێڵێ و ئەمجا پێیان ئەڵێ: بچنەوە مادام شیرەکە درێژ نەبووە تەلاقەکە ناکەوێ. ئەوانیش ئەڵێن ئەی وەقوروانت وین.

- مەلا ئەورەحمان هەبوو لەسولەیمانی، ڕۆژێک هەندێ لە مەلاکانی وەکوو شێخ بابەعەلی تەکیەیی و شێخ نووری بابەعەلی و مەلا حسینی پیسکەندێ رووی لێ ئەنێن کە بانگێشتنێکی نان خواردنیان بکا، ئەویش -سەلامەت بێ- هیچی لەدەست نەئەبووەوە. تا ماوەی شەش مانگ بەمجۆرە لەگەڵی خەریک ئەبن لەئەنجاما بەڵێنیان ئەداتێ کە بابە ئیمشەو بۆ نان خواردن لە ماڵی ئێمە ئەبن و کێش لەگەڵ خۆتان ئێنن بێنن.

ئەمە خەبەرێکی خۆش بوو بۆ ئێوارە مەلاکان هەندێکی‌تریش لەگەڵ خۆیان ئەبەن و ئەچن بۆ ماڵی مەلا ئەورەحمان. بە قسەکردن ڕائەبوێرن و خۆیان ئەخەلافێنن سەیر ئەکەن هیچ دەنگ و باسی نان هێنان نییە. شێخ بابەعەلی خۆی پێ ڕاگیر ناکرێ ئەڵێ مەلا ئەورەحمان برسیمانە کوا نان؟ ئەویش ئەڵێ: قوربان پەلە مەکە. ئەکەوێتە درەنگ، سەیر ئەکەن نان هەر نییە. ئەمجا هەموویان ئەڵێن مەلا لەبرسا مردین کوا نان؟ ئەویش ئەڵێ: «بێ بەلا بن دوانزە مانگەی خوا نان و گۆشت ئەخۆن با ئیمشەو هیچ نەخۆن چی ئەبێ؟»

بەم جۆرە دەستیان پێوە ئەنێ و هیچیان ناداتێ، بەسکی برسی ئەگەڕێنەوە.

- کابرایەکی جاف هەبوو ئیشی هەر دزی کردن بوو. ئەمجا ئەچێ لەلای شێخ کەریمی کربچنە تۆبە ئەکا و ئەبێ بەدەرویشی. شێخ پێی وتبوو ئیتر نابێ دزی بکەی. کابراکەیش چوو بووە کەولی و ئیتر هیچی پێ نەئەکرا چاری نەمابوو. ئەمجا ئەچوو بەشەو ماڵەکەی خۆی ئەبڕی و ئەچوو لەدەرەوە ئەیشاردەوە و لەبەیانیا ژن و مناڵ هەرایان لێ هەڵئەستا. ئەویش ئەیوت: «کەنیشکە مەیکەن وەگاڵە من لغاوی ئەو شێخەم لەدەمایە ناتوانم بچمە کەلەوەر خۆم هاتگم بردگمە».

- کابرایەک هەبوو لەو موکریانە سەی عەزیزی ناو بوو، شێت بوو؛ لە پشیلە زۆر ئەترسا. ڕۆژێک کەروێشکێک ئەگرن و ئەیخەنە کۆشیەوە، ئەویش ئەڵێ: کورە بەرم دەن پشیلە خواردمی. ئەڵێن کورە پشیلە نییە کەروێشکە. ئەویش ئەڵێ: کورە هێزینە پشیلەیە پێی

ئەڵێن پشیلەگوێ کورتەو کلکی درێژە. کەروێشک گوێ درێژەو کلکی کورتە. سەی عەزیزیش ئەڵێ: «هێزینە کلکی کورت و گوێ درێژە، گوێ درێژ و کلکی کورت نییە مادام چاوی شینە ئیشی خۆی هەر ئەکا و ئەمخوا».

- جارێک یەکێ لەحافزەکانی مزگەوتی گەورەی سولەیمانی ئەچێتە حەوزی وسڵ خانەکە مەلە ئەکا. خاڵە فلانیش لەسەر حەوزەکە تارەت ئەگرێ، حافزەکە کە ئەچێتەناو حەوزەکە چاوی نابینێ دەستی ئەکەوێ لەشتێکی نەرمی ئەستووری شلە پەتە بانگی ئەکا خەڵکینە ئەمە منالێکە کەوتۆتە ناو ئەم حەوزە من لێم ون بوو بێن دەری بێنن. خالیشم ئەڵێ: «بابە ئحم هاوار مەکە ئەوە ئالەتەکەی منە».

- کابرایەک هەبوو لە سولەیمانی با بڵێم مەلا سمایلی ناو بوو، هەتیو باز بوو. جارێک لە کەرکووک کوڕێک بەگیر دێنێ و ئەیباتە شوێنێک. کە دێنە دەرەوە کوڕێکیتر تووشی ئەو کوڕە ئەبێ و کەین و بەینی لێ ئەپرسێ. ئەڵێ: وەڵڵا ئەو کابرایە بردمی بۆ ئەوە سواری خۆیم کا. کابرا ئەم قسەیە ئەبیستێتەوە ئەڵێ: «ئەوا هەتیو بازیش حەرام بوو مەگەر بە حوزووری وەلی ودوو شاهد نەبێ».

- مەلایێک جارێ وەعزی ئەدا و لە ناوەندی وەعزەکەدا گەیشتە سەر باسی مەلایکە و وتی شوکربکەن شوکربکەن. هەموو خەڵکەکە دەستیان کرد بە شوکرکردن لەپاشا وتیان مامۆستا ئەم شوکرە بۆچی بوو؟ وتی: «بۆ ئەوە بوو کە خوا رەحمێکی گەورەی پێکردووین بە مەلایکە. ئەگەر مەلایکەکان پیساییان هەبواییە لەو سەرەوە ئیمەیان ئەکرد بەژێر پیساییەوەو جلەکانمان هەموو لەنوێژ ئەبرد.

- هەتیوێکی قومارباز هەبوو لەسەقز مۆلەی ناو بوو، ئیشەکەی ماسی فرۆشتن بوو لەناو شارا. رۆژێ دوو ماسی پێ ئەبێ ئەگاتە بەر دەرگایماڵێکی خانمێکی کاشانی کە مێردەکەی سەرگورد بوو. بە هۆی وەزیفەوە کەوتبوونە ئەوێ. بەدەنگی هەی ماسی مۆلەوە دێتە بەر دەرگای حەوشە. دڵی ئەچێ لەماسیەکان، لەو کاتەشا پارەی پێ نابێ لەگەڵ مۆلەدا رێ ئەکەون کەپێکەوە بنوون و یەکێ لەماسییەکانی بداتێ. ئیش ئەکرێ و مۆلە ماسییەکی

ئەداتێ. خانم ئەڵێ: ئەگەر ئارەزووت لێیە یەکێکی‌تر و ماسییەکەی‌تریش. مۆلە پێخۆش ئەبێ ئەڵێ باشە. مۆلە هەر دوو ماسییەکەی لەدەست دەرئەچێ.

مۆلە کە دەستی لەقنگی هەمانەی بەتاڵەوە دەرئەچێ لەبەر قاپی حەوشەکەدا دائەنیشێ داوای هەندێ ئاوی خواردنەوە ئەکا. خانم لەناو گڵێنەیکدا ئاوی بۆ دێنێ. مۆلە کە ئاوەکە ئەخواتەوە گڵێنەکە دا ئەخات و ئەشکی ئەمجا دەست ئەکا بەگریان. لەو کاتەدا ئاغای سەرگوردی مێردی خانم دێتەوە سەیر ئەکا ئەوا ئەم کورە لەبەر قاپییەکەی ئەوانا دانیشتووەو ئەگری. لێی ئەپرسێ بۆچی ئەگریێت؟ ئەڵێ: قوربان دوو ماسیم پێ بوون هاتم لێرە داوای تۆزێ ئاوم کرد ئەم خانمە نەختێ ئاوی لەناو ئەم گڵێنەیەدا دامێ. کە ئاوەکەم خواردەوە گڵێنەکەم لە دەست کەوتە خوارەوەو شکا. ئێستەخانم لەباتی گڵێنەکە دوو ماسییەکەی لێ گل داومەتەوە. منیش لەترسی وەستاکەم ناوێرم بچمەوەو خانمیش ماسیەکانم ناداتەوە. ئاغای سەرگورد کە گوێ لەمە ئەبێ روو ئەکاتە خانم و ئەڵێ: خانمجان عەیبە گڵێنەیەک نرخی چییە وا تۆ لەباتی ئەوە ئەو دوو ماسیەت لەم بەسەزمانە گل داوەتەوە؟ پێی بدەرەوە بابڕوا گوناحە. خانم چارناچار ئەچێ دوو ماسیەکە دێنێتەوەو ئەیداتەوە بە مۆلە. مۆلە بەخۆی و ماسیەکانەوە ئەڕواو خانمیش ناوێری دە نگ بکا کە کارەسات وانییە.

- مەلا عەلی حاجی مەحموو هەبوو لە سولەیمانی رۆژی لە خانەقای حاجی مەلا عەلی خەریکی دەستنوێژ شتن ئەبێ، سەری دەعباکەی گرتبوو ئەهات و ئەچوو ئەکۆکی و سەرەکەی گرتبووە دەست و ئەیسوو بەدیواری بەر ئاودەستەکەدا «استبرا» ی ئەکرد. «مەجۆلی خامەش لەوێ هەر دەستنوێژ ئەشوا ئەڵێ: مامۆستا ئەوە بۆچ دیوارەکە کون ئەکەی؟ مەلا عەلیش ئەڵێ: «مەجۆل ئەو رەقی قایمیە نەماوە کەتۆ دیوتە».

- کابرایەکی دەرۆزکەر ئەچێتە بەر دەرگایێک و ئەڵێ خێرتان بنووسی شتێکم بدەنێ. لەو کاتەدا ژن و مێردەکە لەژوورەوە خەریکی ئیشی خێرئەبن. ژنەکە لەژێرەوە جارجار نەرمە زیلەیەک ئەدا لە مێردەکەی کە سواڵکەرەکە ئەو قسەیە ئەکا. ژنەکە ئەڵێ: خوا بنداتێ. کابرای دەرۆزەکەر هەر واز نایەنێ، ئەوەی ئەیخۆن لەوە شتێکم بدەنێ. ژنەکە ئەڵێ: من کێر ئەخۆم و مێردەکەم زیللە ئەگەر ئەتەوێ فەرموو». کابرای سواڵکەر لێ ئەدا ئەڕوا و ئەڵێ: «ئەم نیعمەتە خوا هەر بە خۆتانی رەوا ببینێ».

- لە سابلاخ کابرایکی تەوریزییان گرتبوو بەرەواژە سواری کەریان کردبوو بەناو شارا ئەیانگێڕا و لێیان ئەدا. یەکێ پرسی ئەمە چی کردووە؟ وتیان جنێوی بە ئەبووبەکر و عومەر داوە. کابرای کەر سوار گوێی لێبوو وتی: عوسمانیشتان لەبیر نەچێ.

- کابرایێک زستان بوو خەریکی پیرەژنێ بوو. لەکاتی ئیش کردنا دەری هێنا پیرێژنەکە وتی: ئەوە چی ئەکەی؟ کابرا وتی: «وەڵلا تاقی ئەکەمەوە بزانم ناوەوە ساردترە یا دەرەوە؟»

- فایق بێ کەس لە سولەیمانی فێر بوو بوو بە «کەسپەڕ»ی عەرەق فرۆش هەر ئەچوو عەرەقی لێ ئەسەند و ئەیوت لەسەر حساب بینووسە، فلسی نەئەدایە.
ڕۆژێک ئەچێ داوای قاپێ عەرەقی لێ ئەکا و هەر لەدوکانەکەشیا دائەنیشێ بۆ خواردنەوەی. کەسپەڕیش قاپە عەرەقێکی زۆر تورشی بۆگەنی ناخۆشی بۆ دێنێ؛ چونکە ئەزانێ پارە نادا. فایق هەمووی ئەخواتەوە و گوێ ناداتێ، لەکاتی هەستانا تەنها دوو دیناری پێ ئەبێ دوو دینارەکە ئەدا بەکەسپەڕ. کەسپەڕ زۆر سەرسام ئەبێ، ئەڵێ: کاک فایق ئەمە گەلێکی زیادە لەنرخی قاپە عەرەقەکە. فایقیش ئەڵێ: من نرخی قاپە عەرەقەکە نادەم نرخی ئەو وەستایەتیەی تۆ ئەدەم کەچۆن توانیوتە لەقنگێکی وا فراوان بڕیتیە قاپێکی وا تەنگەوە».

- عەلی ئوفێک شەوێک لەنادی ئەبێ سەر خۆش ئەبێ و هەڵئەستێ و ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە. لەڕێگادا ئەکەوێ و ناتوانێ بڕوا. دەوریە تووشی ئەبن و نایناسن ئەڵێن: هەستە بابچین بۆ پۆلیس خانە. ئەویش ئەڵێ: دەجا ئەگەر من بمتوانیایە بە ڕێگادا بڕۆم ئەچوومەوە بۆ ماڵی خۆم». پاشان ئەیناسن و ئەیبەنەوە بۆ ماڵی خۆیان.
- لەو بەر کێو هەموو ئێوارەیێک مامۆستا وەعزی ئەدا. ئێوارەیەکیان وتی: هەر کەس بەشەوی جمعە لەگەڵ خێزانەکەی خۆیا دروست ببێ قەسرێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست ئەکرێ.
ژنێک لەکۆڕی وەعزەکەدا بوو هەستا گەڕایەوەو ئەو ئێوارەیەش جمعەبوو، بە مێردەکەی خۆی وت: پیاوەکە مامۆستا وای فەرموو ئیمشەو جمعەیە با کۆشکێک لە بەهەشتا دروست کەین. کۆشکێکیان دروست کرد. زۆری پێ نەچوو ژنەوتی: پیاوەکە ئەوە بۆ تۆ بوو با کۆشکێکیش بۆ من دروست کەین. کۆشکێکیان بۆ ئەویش دروست کرد. پاش ماوەیێک

ژنەکە وتی: پیاوەکە ئەگەر میوانێکمان هات لەکوێ داینین؟ با کۆشکێکیش بۆ ئەو دروست کەین. بەڵێ میوانخانەیەکیشیان دروست کرد.

پیاوە سەیری کرد ئەگەر بەم جۆرە پێوە برۆن ئەوەندەی کۆشک ئەبێ لە بەهەشتا سەری لێ دەرناکا. ژنە هات بیەوێ قسەبکا پیاوە پێش ئەوە ئەو قسە بکا هاتەوە کار بەلام کردی بەشوێنێکی ترا ژنە وتی چیت کرد؟ پیاوە وتی: «ئافرەت هەر کەس سێ کۆشکی لە بەهەشتا هەبێ ئەبێ خانووە شرێکیشی لەجەحەنەما هەبێت».

– کابرایێک هەبوو «فەتالی» ناو بوو، کەرێکی هەبوو ئەیباتە سنە بیفرۆشێ. ئەچێتە مەیدانەکە جامبازەکان دەوری لێ ئەدەن بەچەند نە بەچەند، بەپێنج تمەن رێ ئەکەون. کابرا ئەڵێ کە پێنج تمەن بێنێ شەش دێنێ لە شەش تمەن کەمتری نادەم. ئەم لاو ئەولا بۆی ئەکەنە شەش تمەن. ئەمجا کابرا ئەڵێ کە شەش تمەن بێنێ، حەوتیش دێنێ لە حەوتمەن کەمتری نادەم، دیسان ئەیبێتەوە بە هەراو بۆی ئەکەن بەحەوتمەن. دیسان ئەڵێ کە حەوتمەن بێنێ هەشتیش دێنێ، لە هەشت تمەن کەمتری نادەم. بەکورتی ئەچن تا دەتمەن کابرا هەر رازی نابێ و ئەڵێ کە ئەوەندە بێنێ ئەوەندەش دێنێ ئەوانیش ئیتر لێی ناکڕن و ئەگەڕێنەوە.

دێتە ئەم لا دەستەیەکی‌تری لێ پەیدا ئەبێ ئەڵێن کەرکەت بەچەند؟ ئەڵێ بە دەتمەن. ئەڵێن نایەنێ بە نۆ تمەن. رازی ئەبێ، یەکێکیتر لەو لاوە ئەڵێ نایەنێ بە هەشت تمەن. بە هەشت رازی ئەبێ. کابرای یەکەم ئەڵێ بابە نایەنێ بە حەوتمەن. ئەم رازی ئەبێ و ئەوان رازی نابن بەکورتی هەر جارە تمەنێکی بۆ ئەشکێنن تا ئەیهێننە سەر یەک تمەن ئەڵێ: «بێنن تمەنەکە، ریشی تەماعکارێکی وەکوو من هەر بۆ ئەوە باشە بچێ بەقینگی جامبازێکی وەکوو ئێوەدا، بەم جۆرە برۆین یەکەمجار من کەرەکەم بۆ مایەوە ئێستە خۆیشمم بۆ نامێنێتەوە».

– کابرایێک هەبوو لەو سەرە گەڕی ئالاندبوو بە هەتیوێکا، کوڕەکەش ئەیوت نابێ و ناکرێ؛ خەلک پێمان ئەزانن حەیای من ئەچێ. کابراش وتی: بابە پاش ئەوە کە بەخێر لێ بوینەوە من تۆ ئەخەمە سەر شانم بەناو بازارا ئەتگێڕم تۆ بانگ بکە بلێ من ئەم کابرایەم گاوە. کوڕەکەش وتی: باشەو ئیش دروست بوو. پاشان سواری سەر شانی خۆی کرد و کوڕە هاواری ئەکردو ئەیوت: «من ئەم کابرایەم گاوە». کابراش لە ژێرەوەو بەدەم رێگا رۆیشتنەوە ئەیوت: «ئەهلی کار خۆیان ئەیزانن».

- لەو ولاتی باسنێ و ڕەشەکانیە مەلایێک هەبوو مەلا عەبدوڵلای ناو بوو. ڕۆژێک قسە لەزانیاری خۆی ئەکا و ئەیوت: من هەموو عیلمێکانم خوێندوە، تەنانەت هندسەش زۆر چاک ئەزانم. یەکێک پێی ئەڵێ: مامۆستا لەحسابا چۆنیت؟ وتی: «حساب هەمووی ئەزانم کەس وەکوو من نایزانێ. من لەیەکەوە باش ئەینووسم تا نۆ، بەلام کە دێتە سەر دە نازانم نوختەکەی لەلای ڕاستەوە دائەنرێ یان لەلای چەپەوە؛ ئەگەینا زۆر چاکی ئەزانم».

- مەلایک هەبوو لەو سەرە «مەلا بامۆک»یان پێ ئەوت، بەمناڵانی ئەخوێند. ئەو مناڵانە کە لایان ئەخوێند مناڵێکی جوانکیلەیان لەناوا بوو «عەول»ی ناو بوو. مەلا بامۆک بە جوانکەلەیی مناڵەکە بۆی دەرکەوت کە دایکی جوانە. ڕۆژێ بەعەولی وت: ڕۆڵە بەدایکت بڵێ: مامۆستام سەلامت لێ ئەکا. ئەویش پێی وت: دایکیشی پێی وت ڕۆڵە پێی بڵێ سەلامی خوای لەسەر بێ و خوا ڕاوەستاوی کا. کەعەول ئەمەی بە مامۆستای وت مامۆستا تۆزێ خۆی قیت کردەوە و لەدڵی خۆیدا وتی: ڕێکەوتووە. ئیتر بەین و بەین سەلامی ئەنارد بۆ دایکی عەول و دایکی عەول هەستی کرد کە چیە بە مێردەکەی وت، مێردەکەشی وتی: ئاسانە تۆ ڕۆژی بەناو دۆستی دڵ و لێبوونەوە بانگی کەرەماڵەوە جا ئەو وەختە ڕێگای خۆی ئەدۆزێتەوە.

دایکی عەول هۆرێ گەنمیان دانابوو بۆ بڕوێش دەستارێکیان لە لاوە دانابوو بۆ ئەوە بیکەن بە دەستارەکەدا خەریکی ڕێکخستنی ئەم تفاقە بوو بە کوڕەکەی وت: ڕۆڵە بە مامۆستات بڵێ با ئیمڕۆ بۆ قاوەڵتی بێت بۆ ماڵەوەو باوکیشت لەماڵ نییە. عەول چوو دایکی چی پێ وتبوو بە مامۆستای وت. مامۆستا جامانەکەی بەستەوە و ڕیشوەکانی بەردایەوە و هەر چاوێکی مستێ کلی تێکردو چوو بۆ ماڵی دایکی عەول. دایکی عەول ماریفەتێکی زۆری لەگەڵ نواند، مەلا بامۆک ئیتر بەتەواوی هاتە سەر پێی.

لەو وەختەدا تەقەی دەرگا هات دایکی عەول وتی: ئەیەڕۆ ئەوە مێردەکەم هاتەوە ئێستە هەر دووکمان هەنجن هەنجن دەکا. مەلا بامۆک وتی: چیم لێ ئەکەی؟ دایکی عەول وتی: بەم پەلە پەلیە لەوە زیاتر ناکرێ هەستە ئەو عەبایە بدە بە سەرتاو لەسەر دەستارەکە دانیشە و دەست بکە بەدەستار کردن، من جوابی مێردەکەم ئەدەمەوە. مەلا بامۆک هەر خێرا عەبایدا بەسەریا و نیشتە سەر دەستارەکە و دەستیکرد بەبڕێ لێکردن. مێردە کردی بەژوورا و دانیشت، وتی: ئۆ ئافرەت ئیمڕۆ زۆر ماندوو بووم. وتی: بۆچی؟ وتی: هۆرێکیتر گەنمم

هێناوەتەوە، ئەترسم ئەوە بەشمان نەکات با ئەم هۆرەشی لەگەڵ بێ. مەلا بامۆکیش عەبای داوە بەسەریاو پشتی کردۆتە ئەمان و خەریکی هارە هارە.

مێردە وتی: ئەو ئافرەتە کێیە وا هارە ئەکا؟ ژنەش وتی: وەڵلا پیاوەکە ئەوە میمکە بەسێ دراوسێمانە -خوا کاری راس بێنێ!- هات وتی من هارەکەتان بۆ ئەکەم. پیاوەش وتی: یا خوا بەخێر بێی میمکە بەسێ ئەترسم عەزیەت بێ بۆت. میمکە بەسێش ورتە لە دەمیەوە دەرنایە هەر خەریکی هارەکردنە. پیاوە وتی: ژنەکە ئەوە میمکە بەسێ بۆچ دەنگ ناکا؟ ژنە وتی: پیاوەکە لێی گەرێ هەژارە گوێرێژکەی کەر بووە. پیاوە وتی: ئافرەت وا دیارە ئێستە میمکە بەسێ قسە نابیەت ئەوی راستی بێ من خۆمم لێخۆش کردووە، چونکە ئەم میمکە بەسێیە لەوەختی خۆیا گەلێ بوختانی بەتۆوە ئەکرد و بەتەواوی ئابرووی منی بردبوو ئێستە ئەبێ هەقی بەر و دوای لێ بکەمەوە ئەو ساوەرشم ناوێ کە ئەو بیهارێت.

ژنە وتی: پیاوەکە ئەیەرۆ عەیبە خەیالی وات نەکردبێ، ئێستە میمکەبەسێ لەسەرەی ئەوەدا نەماوە واز بێنە تا بروێشەکەی بهارێ.

مەلا بامۆکیش کە گوێی لەم قسانە ئەبێ بەتەواوی ناوکی ئەکەوێ، غەیری بروێش کردن نەبێ ناوێرێ هیچ دەنگ بکا.

تەنگی بە هۆرەگەنم هەلچنی چاوەرێی دەرفەتێکە بۆی دەرچی کە هۆرەگەنم هەمووی کرا بە بروێش، پیاوەی مێردە کەوتە جم وجۆڵ مەلا بامۆک سەیری کرد ئیش زۆر خراپە هاتە پێشەوە بە بیانۆی پشوودان و سەر ئاو دەستەوە عەباکەی بەپوختی لەخۆیەوە پێچاو بە بێ خشپە هەستا چووە دەرەوە، ئەمانیش گوایە نایزانن میمکە بەسێ هەستاوە. مەلا بامۆک لەناو ئەم ترس و لەرزەدا بەهەر جۆر بوو خۆی رزگار کرد و فرتەی بۆ کرد بۆ لای منالەکان و لە دەریشەوە عەباکەی فرێدا.

لەپاش چەند رۆژێک دایکی عەول بەعەولی وت: رۆلە بە مامۆستات بڵێ دایکم سەلامت لێ ئەکا. عەولیش ئەم سەلامەی بەمامۆستای گەیاند. مامۆستای وتی: زۆلەی بەچکەزۆلەن ئەوە بۆچی ساوەرو بروێشەکەتان دوایی هاتووە؟

- پیاوێک هەبوو لەو سەرە فەتەی ناو بوو، ژنێکی هەبوو ناوی سەمەن بوو. فەتەو سەمەن گەلێ ساڵ بوو پێکەوە هاوسەر بوون و چەند منالێکیش کەوتبووە بەینەوە. رۆژێک سەمەن هات بەسەریا و لە فەتە تۆرا و ماڵی بەجێهێشت. فەتە لەماڵ نەبوو کە هاتەوە سەیری کرد ماڵ و منال بێ خاوەن و سەمەنیش دیار نییە، لە ئەنجاما تێگەیشت کە ئەمە سەمەن

توراوە. یەک دوو ڕۆژ وازی لێ هێنا سەمەن هەر دیار نەبوو؛ پاشان دراوسێیەکیان هەبوو ناردی بە شوێنیا. سەمەن وتی: تازە ئیتر نایەمەوە بەو ماڵەدا.

بەینێکی‌تری پێچوو یەکێکی تری نارد بەشوێنیا هەر کەڵکی نەبوو. ناچار چووە لای باپیراغا و پێی وت: سەمەنی ژنم توراوە وا هەر چەند ئەکەم نایەتەوە. باپیراغاش «گوڵە»ی کچی خۆی نارد بە شوێنیا. ئەویش هەر چەند ئامۆژگاری کرد بۆ ئەوەی بچێتەوە لای فەتە هەر کەڵکی نەبوو. فەتە هانای بردە لای مەلا کە بەڵکوو ئیشێکی وا بکا سەمەن بگەڕێتەوە. مامۆستاش بە ریشە سپێیە جوانەکەیەوە عەساکەی گرت بە دەستەوە و چوو بۆ لای سەمەن پێی وت: دایکم شەرع ئەفەرمووی ئافرەت ئەبێ لەژێر ئیتاعەی مێردا بێ و نابێ لەئەمری دەرچێ. ئێستە لەسەر چی توراویت؟ ئەم تورانەت موخالەفەی شەرعەو هەستە بڕۆرەوە ناو ماڵ و منالەکانت و چاوەدێری ماڵەکەی خۆت بکە، ئەوا من بەریشی سپێیەوە هاتم بە شوێنتا لەشاخی شەیتان وەرە خوارەوە هەستە پێشم کەوە با بچینەوە. سەمەن وتی: مامۆستا عەزیەتی خۆت مەدە جارێکیکە من نایەمەوە لای فەتە خوات لەگەڵ بێ زەحمەتت کێشا! مامۆستا بە ناهومێدی گەڕایەوە.

فەتە ئیتر دەستی لە هەموو لایێک بڕاو ئیتر سەر لە ئێوارەیەک لەسەر سەرە نوێلکەکە دەستی دابوە ژێر چەناکەی و کەوتبووە ناو دەریای خەم و پەژارەوە «باجی عاسم» هەبوو لەو کاتەدا و لەو حاڵەدا چوو بەسەریا. باجی عاسم یەکێک بوو لە جانانەکانی زەمان. دەم و پلەکەی هەڵۆی لەئاسمان ئەهێنایە خوارەوە.

جا باجی عاسم ڕووی کردە فەتەو وتی: فەتە ئەوە چیە وا دۆش داماوی؟ وتی: باجی عاسم بێژم چی؟ سەمەنی ژنم توریاگە ئەوا کول و کافر بووم لەگەڵی نایەتەوە خۆم و منالەکانی سەرگەردان کردگە. باجی عاسم وتی: هەروا؟ ئا بزانە ئەو وا والێکراوە چۆن بەشەق ئەهێنمەوە. ئەمەی وت و لێیدا ڕۆیشت. کەڕۆیشت سەیری کرد واسەمەن لەبن گوێسە بانەیەکا دەمێ بنێشتی لەدەمایە ئەیجوێ. لەگەڵ دوو سێ ژنی‌ترا دانیشتبوون هێلکە هێلک پێئەکەنێو داویەتە راوی قسە. باجی عاسم هەر لە دوورەوە شێتانی و ڕووی تێکرد و وتی: «ئەرێ هەی قەحبەی ماکەری ئابلاخ! ئەرێ هەی دێلەسەگی دەسا چۆی دەستی هەتیوان! ئەوە بۆچ ناچیتەوە لای ئەو پیاوە؟ ئەوە ئەو منالانەت بۆ بەرەڵا کردوە؟ هەستە هەستە پێشم کەوە هەتا بەشەق گەڵ و قنگم نەکردووی بەیەک. کۆنە حیزەی دێلەسەگ هەستە ڕاست بەرەوە».

هەرکە باجی عاسم ئەمەی لە دەم هاتە دەرەوە سەمەن وەکوو کیچ راپەڕی و چارۆکەکەی دا بە سەریا و وتی: «باجی عاسم گیان! کەی ئەو پیاوە بێفەڕە یەکێکی نەجیمی وەجاخ زادەی نارد بە شوێنما و من نەهاتمەوە. ئەوا ئێستا تۆ هاتی بزانە چۆن لەگەڵت دێمەوە؟ فەتە با خراپیش بێ دڵی تۆ ناشکێنم». وەڵڵا وەکوو شەکرۆکە پێشی کەوت و هاتەوە.

- کابرایەک لەو بەر کێوە کەرێکی ئەگا. کابرای خاوەن کەر چوو بەسەریا و وتی: کورە ئەوەچی ئەکەی لەوێ؟ وتی: وەڵڵا با هێناومی. وتی: ئەی بۆ کلکی ئەو کەرەت خستۆتە بن دەستتەوە؟ وتی: وەڵڵا ئەوە خۆمی پێ ئەگرمەوە بۆ ئەوە بایەکە لەمە زیاتر نەمبا.
سەیری کرد کەڵکی نیە، چوو چاکەتەکەی هەڵدایەوە سەیری کرد دەعباکەی لەوانێکی کەرەکەدایە وتی: ئەی ئەمە چیە؟ وتی: «وەڵڵا قوربان منیش سەرم لەوە سوورِ ئەمێنێ چۆن چووەتە ئەوێوە؟»

- لەکۆڕێکا دوو کابرا کەوتنە دەمەقرە. یەکێکیان هەر تێ نەدەگەیشت. ئەوی‌تریان رووی کردە کۆڕەکە و وتی: «کورە وازی لێبێنن وەچل قورحان تا گوو نەکا نازانێ قنگی لەکوێوەیە؟»

- لەو سەرە کابرایەکی ئاوکێش هەبوو پێیان ئەوت «شیرمەردە». کەرێکی هەبوو هەموو جار بە کەرەکەی ئاوی بۆ ماڵی قازی ئەبرد پارەی ئاوکێشانێکی زۆری کەوتبووە سەر قازی و هەر نەیئەدایەوە. ئیمڕۆو سبەی پێئەکرد، سەرباری ئەمەش کەرەکەشی تۆپی. ئەمجا داوای کرد لەقازی کەوا کەرەکەشم نەماوە ئەو پارەیەم کە لەلاتە بمدەرێ با کەرێکی‌تری پێ بکڕم. ئەمجا کە ئاوم بۆ هێنان ئیتر هیچ پارەم ناوێ. قازی پێی وت: ئێستە پارەم نیە، بەڵام بچۆ یەکێک بدۆزەرەوە کەری هەبێ بیهێنە من بۆت چار ئەکەم.
کابرا چوو گەڕا جوولەکەیکی دیەوە کە کەرێکی چاکی هەبوو. گەڕی پیا ئالان و پێی وت: ئەم کەرە هی منە. جووە هەر واقی وڕما وتی: باوکم! کەر کەری خۆمە. کابرا وتی: نابێ ئەم کەرە هەر هی منە؛ ئەگەر قایلیش نابێ وەرە بچین بۆ شەرع بۆ لای قازی. جووە بە ناچاری بەخۆی و کەرەکەیەوە شوێنی کەوتوو چوون بۆ لای قازی. شیرمەردە بەقازی وت: قوربان ئەم کەرە هی منەو جووە زەوتی کردوە نامداتەوە؟

قازی رووی کردەجووە و پێی وت:

تۆ لەو کەسانەی کەئیماندارن    یا لەو کەسانەی کەبەد کردارن؟

جووە زانی دنیا چ باسە وتی: قوربان!

نەئیماندارم نە بەدکردارم    نەخاوەن مالم وە نەکەردارم

هەلدیم و ئەرۆم هەدە هەدە    کەر بەجێ دیلم بۆ ئەم شیرمەردە

- دکتۆر ئەحمەد گێرایەوە وتی:

لەو خۆشناوەتیە کە یەکێک ئەمرێ بەتایبەتی ئەگەر یەکێکی تۆزێ گەنج وەیا پیاوێکی ناسراو بێ ژنان لەکۆڕێ شینا دائەنیشن بۆی ئەگرین. یەکێک لەژنەکان کە هەر ئیشی ئەوەیە شت ئەلێت بەبالای مردوەکەدا ئەوانی‌تریش لەسنگیان ئەدەن و ئەلێن: وابوو. وتی: جارێک کورێکی گەنج لە هەرتەل مردبوو. ئەو ژنە خوریاکەرە-کە واتە سەردەستە- ئەیلاواندەوە و ئەیوت: بەنان بوو، ئەوانی تریش لەسینگی خۆیان ئەداو ئەیانوت: وابوو. دەستی لەتفەنگ بوو وتیان وابوو. وتی: قیتکەی تاشان بوو، وتیان وابوو. وتی: کوری ئاشان، بوو وتیان وابوو. وتی: راوکەری بەرماران بوو، وتیان وا بوو. وتی بەقاوە و قلیان بوو، ژنەکان دایان لەسنگیان و وتیان: ئەوەی تەقوونێدا نەبوو.

- ژنێک کچێکی هەبوو دابووی بەشوو. کچە ملی نەئەهێنایە ژێر بار بۆ مێردەکەی و خۆی نەئەدا بەدەستەوە. چەند شەوێکیان بەم جۆرە تێپەراند کورەی زاوا چووە لای خەسووەکەی شکاتی کرد کە کچەکەی خۆی نادا بەدەستەوە. دایکی کچەکە چووە لای کچەکەیەوە و پێی وت: رۆلە ئەوە بۆ خۆت نادەی بەدەستەوە؟ بەسیە ئیتر عەزیەتی ئەو هەژارە مەدە. کچەش وتی: دایە دەعباکەی دەعبا نیە هەر چەندە چاوم پێ ئەکەوێ زەنەقم ئەچێ و ئەترسم ورگم هەلدرێ.

دایکەکەش وتی: «رۆلە ئەیەرۆ دەعبات نەدیوە دەعبا دەعباکەی باوکی رەحمەتیت بوو هەر چەند ئەیکێشا بەدایکتا وردە ئاهەنگ و گیز و هۆری پاشی شلەژەی ئەخستە ئاوایی و مەر و مالاتی لەم سەر ئەگێرایەوە بۆ ئەو سەر. کچم دیارە بەختێکی تۆزێ باشت هەیە وازبێنە خوا پێی داوی لەوە زیاتر ئاو مەزایەنە ناو دەمی دایکت.

- کابرایێکی سەید ژنێکی دۆستی ساز کردبوو خۆی کوتابووە پاڵی لەو وەختەدا کە کوتەکەکەی پێوە ئەدا ژنەکە وتی: مامەسەید ئەترسم خەڵک و خوا بوختانمان بۆ هەڵبەستن و حەیامان بچێت. مامەسەیدیش وتی: «ئەوی بوختانمان بۆ هەڵئەبەستێ جەدی گەورەم سلی الله علیەوسلم ئەدا لەبن دەستی».

- دوو ژن بووە شەڕیان یەکێکیان بەئەویکەیانی وت: بچۆ بەو لاوە هەی واوا لێ کراوی حەمەسەن گاوە. ئەوە چۆن لە رووت هەڵدێ قسە ئەکەی؟ ئەویش وتی: «هەی کۆنە قەرەج حەمەسەن منی گاوە یا تۆ؟» کوتوپڕ لەو وەختەدا حەمەسەن بەویدا تێپەڕی، ژنەکە رووی تێکرد و وتی: تۆ خوا خاڵە حەمەسەن ئەم کۆنە لۆتیە دەستە چەورەکەی خۆی ئەهێنێ بەسەر منا ئەسوێ ئەڵێ: تۆ منت گاوە؟ تۆ کەی منت گاوە؟ خاڵە حەمەسەنیش وتی: «کامجاریان ئەڵێیت؟»

- کابرایک شەوێ بە ژنەکەی ئەڵێ: ژنەکە بەیانی ئەچم بۆ شار نەختێ کەل و پەل ئەسێنم و ئەچمە لای کێروەستایەکیش کاورا کەبڕێ کۆڵ بووە دەمەنیایەکی ئەویش ئەکەمەوە تۆیش چیت گەرەکە تا بۆت بێرم؟

ژنە ئەڵێ: خوا نەیوڕێ گشت شتێک هەس ەیچم نەگەرەکە بەلام کە چویتە لای کاورای وەستا بۆ دەمەنیا پێی بێژە پانی بستێک و درێژی دوو بست وێ وەو جۆرە دەمەنیای بکاتەوە، جا خۆیشت چیترت گەرەکە پێی بێژە.

- حاجی ئەورەحمانی کۆیی هەبوو جارێک ئەچێ بۆ ئەو خۆشناوەتیەو ماوەیەک ئەمێنێتەوە. خۆت ئەزانی ناشوکرێ نەبێ خواردنی هەر خۆش لەخۆشناوەتیە هەر گەنمە کوتاوە. ئەویش لەو ماوەدا لەگەنمەکوتاو بەو لاوە هیچیتری دەست ناکەوێ هەر زۆر زۆر هەڵهای برنج ئەکا.

رۆژێک سەر لەبەیان کوتوپڕ گوێی لەدەنگە دنگێ ئەبێ. خۆی بۆ خۆش ئەکا کەئەمە برنج ئەکوتن. ئەو رۆژە بەیادی برنجەوە نیوەڕۆ نیوەرۆژە ناکا ئەڵێ: با ئێوارە زۆر بخۆم. ئێوارە پاش نوێژی شێوان ئاو دێنن و دەست ئەشوا ئەویش سمێلی خۆی لێ داوەتە لاوە کە ئێستە پلاو ئەخوا کەنان دائەنرێ سەیر ئەکا هەر گەنمەکوتاوە. بەجارێ ئەچێتە تاسەوە و نایخوا سکیشی لەبرسانا هەر قوڕەی دێ.

کابرایَ خانەخویَ پێی ئەلیَ: عاجی ما ناخۆی؟ ئەلیَ: ناخۆم. ئەلیَ: ئاخر کەدەستت شوشت ما ناخۆی؟ ئەلیَ: کورە کەدەستم شُشت دەستم لێی شُشت.

- ژنێکی کورد منالێکی کۆرپەی هەبوو هەلی ئەپەڕان و ئەم بەیتانەی بەسەرا هەلئەدا:

خوا بیدا نیازم — حەو ژنە رات بخوازم

یەکیَ تورک تەماشا — یەکێکی دود پاشا

یەکیَ رای سەر سینە — یەکیَ رای پەرۆپینە

یەکێکی رای دەرکۆلین — یەکێکی پەی تیکەگلێن

یەکێکیش رای چلم هەلقۆرێن

- پیاوێک هەبوو هەژار بوو باسی مەردمی دنیای وا ئەکرد:

نیوەی سوار کلاش چەکە — نیوەی سوار محنەتە

نیوەی غەرق غەزنەی لالە — نیوەی ئاتاج تۆپیَ شالە

## تاقی کراوەکانی کوردی

- ئەلێن ئەگەر مەڕ تووشی «پزوو » (پەتا) بوو لنگە کلاشێک بکەنە ملی لەکۆلی ئەکەویَ.

- ئەلێن ئەگەر منالیَ تووشی «بازیلە» بوو بێنن زراوی گا ئاوە تالەکەی لەگەل «شەویار»(سبر) پێکەوە تێکەلاوکەن و بیسوون بەسەر سنگ و موسلدانیا بازیلەکەی لەکۆل ئەکەویَ.

- ئەلێن ئەگەر منالی کۆرپە کە بەرچاوەزار و نەفەس کەوت لەوەختی زەردەپەڕی خۆراوا قانگ بخەنە سەر ئاگر منالەکەو دایکی منالەکە خۆیانی پیا بگرن نەفەسی چاوەزارەکە نامێنیَ.

- ئەلێن ئەگەر منالی کۆرپە پەنجەگەورەی پێی خۆی برد بەدەما و مژی ئەوە کوڕ بەشوێن خۆیا دێنێت.

- ئەلێن ئافرەتی سک پڕ ئەگەر تۆزیَ زیاد «رەشکە» (سیاولە) بخوات بەرەکەی ئەخا.

- ئەلێن ئەگەر پەڕی سیسالکە کەچەلە «رخمە» لە هەر مالێکا بسووتێنن هەر جرِوجانەوەرێکی زیاندار لەو مالەدا هەبیَ هەموو هەلدێن.

- ئەڵێن ئەگەر ریقنەی سیسارکە کەچەڵە لەژێر ئافرەتی سکپڕدا بسووتێنن بەرەکەی ئەخا.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ نینۆکی دەست و پێی پێکەوە بکا دایکی و باوکی پێکەوە ئەمرن.

- ئەڵێن پیاز لەماڵا بڕوێترێ بەدیومەو ئەو ماڵە وێران ئەبێ.

- ئەڵێن سەری زل و گوێی بچووک نیشانەی ژیری و زیرەکیە. سەری بچووک زۆر گوێی زلیش نیشانەی بێ ئەقلی و نەزانینە.

- ئەڵێن ژنی سک پڕ بنێشت بجوێ لەپاشا ئەو منالە زۆر کات گوێچکەی ژان ئەکا.

- ئەڵێن ژنی سک پڕ ئەگەر گۆشتی گابخوا لەپاشا منالەکەی تووشی بازیلە ئەبێ.

- ئەڵێن ئەگەر جوجکی تازە لە هێلکە دەرچوو لەدەنوکەوە هەڵبگیرێ ئەگەر جولایەوە ئەوە کەڵەشێرە ئەگەر نەجولایەوە ئەوە مریشکە.

- ئەڵێن ئافرەتی سک پڕ کە دڵەکزە بیگرێ ئەوە منالەکەی تووکە سەری هەیە.

- ئەڵێن منالی ژیر پێی بخورێنێ ورگن ئەبێ.

- ئەڵێن گوڵی هێرۆو ناوکە بەهێ پێکەوە بکوڵێندرێن بکرێن بە چا و پیاو بیخواتەوە بۆهەلامەت باشە.

- ئەڵێن ئەگەر منال چووە تەوسەوە بێنن لەو کاتەدا کە تەوسەکە ئەیباتەوە تۆزێ لەجلەکەی بەری لە عاستی ناو مۆرتخەی پشتیەوە بەمقەست هەڵێنن بیسووتێنن لەلایەوە، ئەمجا بزمارێکیش لەو عاستەدا -واتە ئەو شوێنەکە پیرانەکەی تیا کراوە- بکوتن بەئەرزا تەوسکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

- ئەڵێن بە هاوین نینۆک زۆرتر دێ تا زستان.

- ئەڵێن منال کە خەتەنە ئەکرێ ئەو زیادە پێستەی کە ئەیبڕن، هەڵیگرن بە پەتێکەوە وشک ئەبێتەوە، هەر وەخت ئەو منالەوە یا منالێکیتر بە «بۆن» کەوت بێنن زیادە پێستەکە بخەنە ناو ئاوو هەڵیفلەقێنن سەر و مێشکی منالەکە بشۆن و مەلاژوی هەڵبدەنەوە بەلام پەنجەکە بەو ئاوە تەڕ بکرێ بۆنەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

- ئەڵێن یەکێ میز وەیا ئاو بەپشیلەوە یا سەگ بکا بالووک دەر ئەکا.

- ئەڵێن هەر کەسە زەردەواڵەیک بکوژێ خورمایەکی لە بەهەشتا ئەدرێتێ.

- ئەڵێن لەکاتی نووسینا ئەگەر قەڵەم سەرو بن هاتە دەستەوە، ئەوە پارە دێتە دەست ئەو کەسە.

- ئەڵێن ئاوی ڕێواس لەگەڵ ئاردی جۆ تێکەڵ بکرێ ئەو کەسەی کە زیپکە وەیا سوورەبای هەیە لەشی خۆی بهەنوێ چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن ئاوی ڕێواس بۆ «وەبا، ژانەسەر، زەردووی و فشار خوێن» باشە.

- ئەڵێن خواردنی ڕێواس بۆ بەهێز بوونی دڵ وجگەر باشە.

- ئەڵێن قارچک زۆر خواردن ئەبێتە هۆی نەخۆشی کۆڵنج و ورگ و نەهێشتنی تۆوی مناڵ.

- ئەڵێن ژنی سک پڕ کەماری چاو پێ کەوت مناڵەکە لەپاشا هەر زمان دەردێنێ.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ تووشی زەحیری بوو سێ ڕۆژ خۆی بگرێتە برنجی ڕۆن کەم خواردن یەعنی قوبولی ڕۆن چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن هەویر کە پەڕی ئەوە میوان دێت.

- ئەڵێن تفەنگێک کە هەزار نێچیری کوشتبێت ئیتر نێچیر لەبەری ڕاناکاو خۆی ئەدا بەدەستەوە بۆی.

- ئەڵێن یەکێ سەیری ئەو کەسە بکا کە هەڵواسراوە-واتە دراوەتەدار- کەم فیکر ئەبێ.

- ئەڵێن یەکێ ئەسپێ بەزیندویتی فڕێ بدا شتی زوو لەفیکر ئەچێتەوە.

- ئەڵێن ئەگەر مشک لەشتێکی خوارد وەیا خواردەوە ئەگەر یەکێک لەو شتە بخواتەوە کەم فیکر ئەبێ.

- ئەڵێن خواردنی سێوی ترش کەم فیکری دێنێ.

- ئەڵێن زۆر خوێندنەوەی کێلی قەبر ئەبێتە هۆی شت لەفیکر چوونەوە.

- ئەڵێن یەکێ میز بکاتە ناو ئاوی ڕاوەستاوە کەم فیکر ئەبێ.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ سێبەرۆی هەبوو شاخی گا بسووتێنرێ و تێکەڵاو بەخواردنی بکا و بیخوا سێبەرۆکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

- ئەڵێن ئەگەر بەزراوی گا هەر دارێک بهەنون ئەو دارە کرم هەڵناهێنێ.

- ئەڵێن: ڕەقینەی پێی گا بسووتێنرێ و بهێنرێ بەدەم و دانا دانەکان سپی ئەبنەوە.

- ئەڵێن خواردنی شیری مانگای زەرد زەردویتی لائەبا ئەگەر لەگەڵ دۆدا بخورێ بۆ نەهێشتنی مایەسیری باشە.

- ئەڵێن زروای بزن لەگەڵ «نەوشادر»دا تێکەڵاو بکرێ لەلەشی ئینسانا ئەو شوێنەی کەمووی هەیە بیانەوێ ئیتر مووی لێ نەیێ موەکان هەڵکەنن لەو زراو و نەوشادرەی لێبدرێ ئیتر مووی لێنایێ.

- ئەڵێن بەشیری بزن لەسەر کاغەز بنووسرێ خەتەکەی دەرناکەوێ، بەلام کە خۆڵەمێشی پێوەکرا خەتەکە دەرئەکەوێتەوە.

- ئەڵێن ئەگەر تەنراوی جاڵجاڵۆکە بخرێتە سەر تازەبرینی تەڕ و نایەڵێ خوێنەکەشی ئەوەستێنێتەوە.

- ئەڵێن زیوێ کە رەنگی تێکچووبێ تەنراوی جاڵجاڵۆکەی پیا بێنن رەنگ هەڵدێنێتەوە.

- ئەڵێن مقناتیسی ئاسنکێش کە سیری لێ نزیک خرایەوە ئەوا ئەو هێزی راکێشانی نامێنێ بەلام کە بەسرکە بیهەنوون هێزەکەی بۆ ئەگەڕێتەوە.

- ئەڵێن کەحوشتر چاوی بکەوێ بەئەستێرەی سوەیل هەر خێرا ئەمرێ.

ئەڵێن: تووکی حوشتر یسووتێنرێ و بخرێتە سەر ئەو شوێنە کەخوێنی ناوەستێتەوە ئیتر گورج خوێنەکە دەوەستێتەوە.

-ئەڵێن: ژنی نەزۆک ئەگەر مۆخی لەولاقی حوشتر بپێچێنێ بەتۆوی لۆکەوە یا خۆریەوە لەپاش پاک بوونەوەی لەحەیز سێ رۆژ ئەو شافە هەڵبگرێ و لەگەڵ مێردەکەیا پێکەوەدروست ببن سکی پڕ ئەبێ.

- ئەڵێن: نەپیاوی پیر بنێرە بۆ کەرکڕین، نەپیاوی برسی بنێرە بۆ نان کڕین، نەپیاوی گەنج بنێرە بۆ ژن خواستن.

قسەکەش ئەوەیە کە پیاوە پیرەکە لە بەر پیری کەری چاک و خراپ لێک جیا ناکاتەوە هەر ئەڵێ پێم لە ئەرز ببڕێ هەر باشە. پیاوە برسییەکەش لە بەر برسێتی نانی چاک و خراپ لێک جیا ناکاتەوە هەر ئەڵێ سکم پڕکاتەوە چاکە. پیاوە گەنجەکەش لە بەر چلێسی ژنی جوان و ناشیرین لێک ناکاتەوە هەر ئەڵێ ئیشم جێبەجێ ببێ هەر چۆن بێ هەر باشە.

- ئەڵێن: ئەگەر پیاو رژدبوو ژنەکەی بەئازارەوە درەنگ منالی ئەبێ.

- ئەڵێن: یەکێ ئەلامەتێ بێ نافەکەی دەرپێکەی خۆی بگرێ بەئاگرا و بۆنی بکا ئەلامەتەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

- ئەڵێن: ژنی سکپڕ کە رووی زەردەو باریک بوو ئەوە سکەکە کوڕ ئەبێ؛ ئەگەر گەش و پان و پۆڕبوو ئەوە کچ ئەبێ.

- ئەڵێن: منالی ساوا ئەگەر کۆشی خۆی گرت و هەڵیدایەوە ئەوە داوای رۆژی ئەکا بۆ باوک و دایکی.

- ئەڵێن: منال کە لەبێشکەدا نەبوو بێشکەکەیان راژەند ئەوە منالە ژان ئەکا.

- ئەڵێن: چۆلەکەو کێچ لەگوندی «تەوێلە»دا نیە.

- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ «ڕات الجنبی» بوو، قرژاڵ بپشێنێ و لێی بنێ یا ئەیکوژێ یا چاکی ئەکاتەوە.

- ئەڵێن: یەکێ کە چاوی بفرێ تۆزە نانێکی بخاتە سەر فڕینەکەی ئەوەستێتەوە.

- ئەڵێن: مرشک کاتێ هێلکە ئەکا لەو کاتەدا کە هێلکەکە لەقنگی دەرئەچێ پێش ئەوە هەوای لێکەوێ ئەو هێلکەیە بەر هەر شتێک بکەوێ وەیا بکەوێ بەسەر هەر شتێکا وێنەی ئەو شتە وەرئەگرێ.

- ئەڵێن: کەروێشک وتویە هەر چوار پەلم بە گەڵی ئەو کەیبانووە کە ئەمنێتە سەر قبووڵیەوە.

- ئەڵێن: ئەگەر مار تەماشای زومورت بکا کوێر ئەبێ.

- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ «چغگ» (فشار)ی هەبوو بێنێ ٦٠ دەنک عەناب لەگەڵ مستی جاتری وشک (ئەگەر جاتری تەر نەبوو ئەگەینا ئەگەر تەڕیش بوو ئەوەندە بێ کە ئەگەر وشک کرێتەوە مستێک بگرێتەوە) سەر لەئێوارە بیکاتە ناو خامێک و نزیکەی پێنج شەش پیاڵە ئاوی تێکا تا بەیانی لەناو ئاوەکەدا بمێنێتەوە بەتەواوی تام ئەداتەوە. ئیتر هەر لەناو ئەو ئاوەدا بمێنێتەوە ئەمجا بێنێ هەموو نان خواردنێک ئیستکانێکی لێ بخواتەوە، ئەتوانی چ دوو سێ ڕۆژیش هەر جارە کە ئیستکانەکەی لێ ئەخواتەوە ئیستکانێکی‌تر ئاوی تێکاتەوە کە ئەو ژەمە تەواو بوو دیسان هەر وەکوو وترا ژەمێکی تر بگرێتەوە بەم جۆرە ماوەیەک لەسەری بڕوا زەختەکەی نامێنێ و لەکۆڵی ئەکەوێ.

- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ گوێی ژان بکا پیاز بپێشێنێ تۆکەکەی هێشتا بەتەواوی سارد نەبووتەوە بینێتە ناو کونی گوێی ئیتر ژانی نامێنێ.

- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ میزی ڕانەئەگرت بەڕوو بکوڵێنێ ئاوەکەی بخواتەوە، وە یا بەڕووەکە بەبرژاوی بخوا میزە جۆرتکەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

- ئەڵێن: یەکێک ئەگەر دەردی بەڵەکی هەبوو بەپێی پێخاوس بە هەر شوێنێکا بڕوا ئەو شوێن پێیەی ئیتر گیای لێناڕوێ.

- ئەڵێن: پیاوی کوێر زۆر حەز لەژن ئەکا و پیاوی خەساو چاوی زۆر تێژە.

- ئەڵێن: یەکێ نەخۆشی شەکری هەبێ خۆی بگرێتە خواردنی «شەوەر» (سێپەڕە) نەخۆشییەکەی بەتەواوی لێ ئەکەوێ.

- ئەڵێن: کچ و ژن بەوە جیا ئەکرێتەوە کچ هەڵئەستێ بڕوا لەپێشا پێی چەپی پێش ئەخا، ژن پێی ڕاستی پێش ئەخا.

- ئەڵێن: یەکێ سکی بچێ بەئەندازەی ئیستکانێ ئاوی پوونگە بخواتەوە لەکۆڵی ئەکەوێ؛ واتە پوونگەکە ئەگەر تەڕ بوو ئاوەکەی بگوشن ئەگەر وشک بوو ئاوی تێکەن ئەوەندەی بکوڵێنن تا ئاوە ساغەکەی خۆی ئەمێنێتەوە.

- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ سکی بچێ نۆک بخوا ئەیوەستێنێتەوە.

- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ دەنگی بنووسێ فنجانێ قاوەی تاڵ، ڕۆنی زەنگی تێبکرێ و بیخواتەوە دەنگەکەی بەرەلا ئەبێ.

- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ بریندار بوو برینەکە لەگۆشتدا بوو، میزی مانگای زەرد بێنن بیکوڵێنن ئەوەندە بکوڵێ تا ئەبێ بە مەعجوون، ئەمجا بیکەن بە فتیلە ئەگەر برینەکە کۆن بوو هەر لێی بنێن چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ تووشی سێبەرۆ بوو سیر بێنی وەکوو چۆن دەنک دەنکەو دەنکەکانی پێکەوە نووساون لێکیان بکاتەوە. ئەمجا ئەو دەنکانە بە دەرزی کونکون بکا بەجۆرێ کە کونەکان دیوەو دیو ببن دەنکی چەند کونی وای تێبکا. لە وەختی نووستنا ئەو دەنکانا قوت بدا یەک دوو شەو وا بکا سێبەرۆکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

- ئەڵێن: بۆن کردنی ڕەیحانە بۆ هەلامەت باشە.

- ئەڵێن: ئەگەر مار چاوی بە ئینسانی رووت بکەوی لێی هەڵدێ.

- ئەڵێن: چای وشک لەگەڵ زەردێنەی هێلکە بکرێ بەمەعجون و بکرێ بەشاف ئەو کەسەی سکی ئەچێ هەڵیگرێ بۆی باشە.

- ئەڵێن: یەکێ وشکە بیرۆی هەبوو لیمۆی ترش بە توێکڵەکەیەوە بەسەر یەکا بگوشرێ و ئاوەکەی بگیرێ سێ ئیستکان لەو ئاوە بخواتەوە چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن: یەکێ نەخۆشی شەکری هەبوو ناوکی خورمای ناوی بهاڕێتەوەو ورد وورد پاشان وەکوو قاوە لێ بنێ و بیخواتەوە چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن: یەکێ هەر ئەڕشایەوە قۆیناخی بدەنێ چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن: یەکێ پێکەنین بیگرێ سەیری نینۆکی خۆی بکا پێکەنینەکەی لا ئەچێ.

- ئەڵێن: لەو کوردەواریە لە ئاوایی کاکە، سەگی ڕەش لوورانی ئەوە بەلایەک دێت بەسەر ئەو ئاواییەداو سەگەکە لەدوورەوە چاوی لێیە ئەلوورێنێ ئەڵێ: لەم ئاواییە دوور بێت کە بەلاکە نزیک کەوتەوە ئەو هەر ئەلوورێنێ و ئەڵێ: لەماڵی خاوەنەکەم دوور بێت. کە بەلا هاتوو رووبەرووی ئەو نزیک کەوتەوە کلک ئەگرێ بەناو گەڵیا و بەلوورە ئەڕوا و ئەڵێ: «لەخۆم بەدوور بێ».

## پێشەکی

بیری منالی تیژە. ساڵ ساڵی ۱۳٤۷ ی هیجری بوو، سەید ئەحمد ناوێک بۆ جاری سێیەم لە مەککە و مەدینەوە پەخشیەکی بڵاو کردەوە کە پێغەمبەر (د. خ) لەخەوا پێی وتووم لە ساڵی ۱۳٥۰دا دنیا دوایی دێت، کێوەکان ئەڕووخێن و عالەم ئیتر هەپەرون بە هەپەرون ئەبێت.

فلانی! لەمزگەوتەکان و لەماڵەکانا شین وشەپۆڕێک بوو ئەو سەری دیار نەبێتەوە. شێخ جەلالی برای شێخ نەجیبی قەرەداغی، حاجی فەتاحی قەزاز، ئەحمەدی قادر چاوش، حاجی مەحەمەدی عەنبەر و گەلێکی‌تریش ــ یا ڕەبی بەرەحمەت بن!ــ لەسەر سەکۆکەی مزگەوتی شێخ جەلال پرمەپرم ئەگریان و دەستەسڕەکەی دەستیان بەتەواوی تەڕبوو بوو؛ عالەمەکەی‌تریش بۆ گریان شوێنیان ئەکەوتن. منی نەگبەتیش هەر ئەگریام. ئەوا ئەوان وەکوو کابرا وتی بەهەر جا! من بۆچی؟ من هێشتا لەناو منالانا یاریم ئەکرد، نەئەمزانی دنیا چییە، نە قیامەت.

ساڵ بوو بە ۱۳٥۰، دنیا نەبوو بەدنیا ئاخری. لەدوای ئەوەش ساڵ هەر سنگی ئەنا بۆ پێشەوە. تا بوو بەساڵی ۱۳۸۹ دنیا هەر وەکوو خۆی مایەوەو نەبوو بەدنیا ئاخری. وا دیار بوو سید ئەحمەد -خوا سەلامەتی کا!- خەوەکەی دەست هەڵبەست بوو. لەماوەی ئەم ٥۱ ساڵەدا تۆ ئەزانی چ جۆرە کارەساتانێ ڕوویان دا؟ وەکوو ئەڵێ: ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە؛ ڕۆژی پێرێ ڕۆیی، ڕۆژی دوێنێ هات، دوێنێ ئیمڕۆی بەشوێنا هات. هەموو وەکوو تۆمار پێچرایەوە.

با بێینەوە سەر ساڵی ١٩٥٧ی میلادی. لەو ساڵەدا بەحساب بوو بە ٣٠. ساڵ دوای دوایی هاتنی بەخەوەکەی سەی ئەحمەد لەباتی ئەوە دنیا دوایی بێت، کەچی بەرگی یەکەمی «رشتەی مرواری» لەدایک بوو. هەر ئەو ساڵە بەرگێکی‌تر. ساڵی ١٩٥٨ بەرگی سێیەم، ١٩٦٩ بەرگی چوارم، ١٩٧٢ بەرگی پێنجەم. لەو ماوەوە تا ئێستا ئێش و کاریتر ماوەی نەدام بتوانم لەسەری بڕۆم. ئەوا لەم ساڵەدا ساڵی ١٩٧٨ گەڕامەوە بۆ کۆنەچاڵ. بۆ دەرکردنی بەرگی شەشەم. ئەمەی کە لەبەردەستتایە.

ئم! مامۆستا ئەڵێ رشتەی مرواری لەو ساڵەدا لە دایک بوو، لای وایە شێری بەگوێ گرتووە. وەیا ئەستێرەی لەئاسمان هێناوەتە خوارەوە، یا کەشتی لەئەرزەوە بردوە بۆ ئاسمان.

برا کاڵا لەقەد باڵایە. ئەو نەتەوەیە کە کەشتی بردوە بۆ ئاسمان غەیری نەتەوەکەی منە. من کە لە نەتەوەی کوردم هەر ئەوەندەم لەدەست دێ. تۆ دەرزیەک دروست بکە من سووژنێک دروست ئەکەم؛ من دریغیم نەکردووە هەر ئەوەندەم لەدەست دێت. هەموو کەس نابێ بەداهێنەرو دوکتور و موهەندس و کیمیاگەر. نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب. من ئەوەم لەدەست دێت کە خزمەتی نەتەوە بکەم لەڕێگای ئەدەبەوە. تا بمێنم لەو ڕێگایەدا ئینشاللا دریغ ناکەم.

لەماوەی ئەم ٢١ ساڵەدا گەلێ لەدۆستانی دێرینەم لەدەست دەرچون. گەلێ لەو کەسانە کە شتیان بۆ گێڕابومەوە، وەیا بۆیان ئەناردم بو «رشتەی مرواری» لەدەسم دەر چون و ڕوویان کردەوە بۆ بارەگای ئیزەدی. وا دیارە خەوەکەی سەی ئەحمەد لەماوەی ئەم پەنجاویەک ساڵەدا بەچاو ئەوانەوە هەندێکی هاتەدی. ئەوان ڕۆیشتن و من هەر مامەوە. لەبەرگی یەکەمەوە دوور نییە هەندێ کەس بیانوتایە ئەویش ئەچێتە ناو کووپەڵەکە، کەچی دووەم هات و من نەچووم، سێیەم هات و من نەچووم، چوارەم و پێنجەم هات هەر نەچووم، خۆ بەخوا هەر ئەچم؛ «مەولەوی» ئەڵێ:

وەمەرگت دیدەم هانە گوزەردا    منیچ ڕای لای تۆن، ئارۆ نە فەردا

بەڵام تۆ خوا وازم لێبێنە بازلیا و پلیاوێکی‌تر بکەین.

ناڵێم ئەدەب چییەو کەڵکی چییە بۆ نەتەوە؛ چونکە لەپێشەکی بەرگەکانی ترا ئەمەم زۆر وتووە، زۆر وتنیش قورعان خۆشە! لێرەدا هەر ئەوەندە ئەڵێم «رشتەی مرواری» چەند بەرێکی بەکەڵکی هەیە: یەکەم ئەدەبە و ئەدەب نەتەوەیە. دووەم ڕێبازێکە بۆ خوێندنەوەی کوردی. زۆر شت هەیە ڕێبازە، بەڵام ئەم وا لەمرۆڤ ئەکا پێوە بچێت و بیخوێنێتەوەو هیچ تاقەتیشی نەچێ، چونکە زاخاوێکە بۆ مێشک. سێیەم وەکوو لەش پێویستیە بەحەسانەوە،

فیکرو مێشکیش ئەو پێویستیەی هەیە. حەسانەوەی فیکر ئەوەیە کەخۆشیەکی بگاتێ بەبێ ئەوە کە لەشەکە بۆی بکەوێتە عەزیەتەوە. قسەکانی «ڕشتەی مرواری» تۆ بەگاڵتە وەری ئەگری و خۆشیەک ڕوو ئەکاتە فیکرو مێشکت. لەگەڵ ئەم خۆشیەشا دەرسێکە بۆ هەموو ڕووداوێکی ژیان، کەئەم دەرسە لەپشت پەردەی خوێندنەوەکەوەیە.

شتێکی‌تر ماوەتەوە با بیلێم:

ئەو ساڵە کە لە «وەندەرێنە» بووین، سەبەتەیە ترێ دۆشاوی گیانمان ئەهێنا بۆحاجی فەرەجی پلاوخۆر لەشار بەچوار روپیەو سێ عانە. حاجی فەرەجی رەحمەتی هەر لە بەیانیەوە تا ئێوارە بەلایەوە ئەمایەوە لەبەر گرانیی بۆی نەئەفرۆشرا. زەمانی هۆقەبوو، نەک هۆقەی ئەستەموول، بەڵکە هۆقەی سلێمانی کە سێ کیلوو نیوی ئێستە بوو. هۆقەی ئەدا بەچوار عانە کەسێ نەبوو بلێ کەرت بەچەند. ئەیانووت بەخوا گرانە پێمان ناکرێ.

ئێستە لەسەر مەرج تۆ کیلووێک_ نەوەک هۆقەیەک_ لەو ترێ دۆشاوییە بدە بەمن بە هەشت روپیە کە ئەکاتە شەشسەد فلس، من دوعات بۆ ئەکەم. دەسا حاجی فەرەج لەکوێیت گۆڕ هەڵتەکێنە. کەچی بۆ بەدبەختی من هەر شتێک دەرئەکەم و هەرشتێک ئەنووسم، ئەڵێن ئای بەخوا گرانە! بەخوا زۆر دڵم پێی خۆش ئەبێ ئەگەر ئەم قسەیە نەکەی، ئەو وەختە هەر دووکمان پێکەوە دەست ئەگرین بەدەستی یەکەوە. بەدوو قۆڵی ئەچین بۆ جەحەنەم، یا بۆ بەهەشت! تۆ سەر پشک بە. کامیت ئەوێ من شوێنت ئەکەوم هەر بەو شەرتە نەڵیت کتێبەکە گرانە. زۆر لەم قسەیە ئەترسم! ئای ترس! هەر شتێکی‌تر بلێیت گەردنی خۆم و خۆت ئازاد بێ.

عەلائەدین سەجادی

١٩٧٨/٥/٢٨

# تاقگەی ئێلاخ

– دوو برا لێفەیکێ بچووکیان کڕیبوو. دنیا زستان بوو، شەوێ ویستیان پێ بنۆن کابرایەکی کوردیش بوو بەمیوانیان چوو لەناوەڕاستیانەوە ڕاکشا. شەوێ بەتەواوی ساردی کرد، براکان هەر یەکە لەبەر سەرما لێفەکەیان بۆ لای خۆیان ڕائەکێشا. کابرای میوانیش هیچ نقەی نەئەکرد، تەنها ئەوە نەبێ ئەیوت: «من پارەم نەداوە ڕایناکێشم». لەگەڵ ئەوەش هەر کام لەوان ڕایانبکێشایە بەشی ئەوی هەر ئەمایەوە.

– مەلا یووسف هەبوو لە «تەنگیسەر»، مەلا عەلیش لە «سەرزەل»؛ سەرزەل و تەنگیسەر دوو گوندن لەقەرەداغ. کە یەکێک ئەچوو پرسیارێکی شەرعی لە مەلایووسف ئەکرد مەلا یووسف ئەیوت: «برا ئەمە گیای من و مەلاعەلی سەرزەل نییە؛ ئەمە گیای شێخ نەجیبی قەرەداغە». شێخ نەجیب هامێکی زۆر گەورە بوو لە زەردیاوای قەرەداغ. مەلاعەلی چەند جارێک ئەم قسەی مەلا یووسفە ئەبیستێتەوە. ڕۆژێک ئیتر جیقڵدانەی هەڵیناگرێ ئەچێتە سەر مەلایووسف پێی ئەڵێ: «مەلایووسف! خوا بتگرێ تۆ کە شتێک نازانی من بە خۆتەوە بۆچ ئەپێچی؟ بەچیدا ئەزانی کە منیش نایزانم؟»

– کابرایەکی کوردی جافەتی برینێک لە لاڕانی هاتبوو خۆی چاوی لێنەبوو. دوانزە کوڕی هەبوو بەیەکێکیانی وت: «ئا، ڕۆڵە وەرە سەیرێکی بکە بزانەچۆنە؟» کوڕە هات و سەیری کرد وتی: «باوە، ئاوی تێزاوە». ڕووی کردە یەکێکی تریان پێی وت: «ڕۆڵە! ئاتۆش وەرە سەیرێکی بکە». ئەویش هات وتی: «بابە سەرەکەی سوور بووەتەوە؛ لام وایە دەمە دەمی گەیشتنیەتی». بانگی یەکێکی تریانی کرد ئەویش هات قسەیکی تری کرد. تا هەر دوانزەیان هاتن و هەر یەکە بەجۆرێک پێیان وت. پاشان کابرا سەری بەرز کردەوەو وتی: «ئۆ! خوا خەڵکی وەیەک کەسەوە هەموو خەبەرێکی لە ئەستەمووڵەوە بۆ تێرنەوە، من وە دوانزە کوڕەوە خەوەرێکی ڕاستم لە قنگمەوە تاگوێچکەم دەست ناکەوێ».

– دزیک شەوێک ئەچێتە ماڵەکوردێک هەر چەندە ئەگەڕێ هیچی دەست ناکەوێ، بەناچاری ملی ڕێ ئەگرێ و بەرەو دوا ئەگەڕێتەوە. خاوەن ماڵەکە ئاگای لێیە، پێی ئەڵێ:

